## بەیتی سەرەمەڕ

سوریا، دمشق ٢٣/ ١/ ١٩٥٧: ساڵی ١٩٤٨ ڕۆژێک لە ڕۆژان لە ڕۆژنامەییێکی عەرەبیدا لە ژێر درۆشمی «کۆشکی بلوورین»دا چیرۆکێکی کورتی ڕەمزیم خوێندەوە کە لە بوێژی تورک «صباح الدين علي» وەرگیراوە. چیرۆک نزیکەی نیو رووپەڕی ڕۆژنامەی گرتبوو. هەرچەندە زۆر لە پەردەدابوو، زۆر بەنهێنی پیاوی تێ دەگەیاند کە مەبەستی چییە. بەڵام دیسان زۆر کاری کردە سەر مێشک و دڵم. پوختەی چیرۆکم هەر لەدڵدابوو تا هێنامیە سەر ئەو بیرە کە ئاوا پان و پۆڕی کەمەوە و هەرچەندی کێشی دێت ڕایکێشم و چی لە دڵمدایە بۆی بکەمە نێوئاخن. ئەگەرچی بەشی زۆری من لەخۆمەوە پەڕوپۆم لێناوە و پەرِم تێدا هەڵاویشتووە. بەڵام هەر لەسەرمە زۆر سوپاسی گیانی پاکی ئەو بوێژە بەرزەی تورک بکەم کە بناغەکە ئەو دایڕشتووە. بۆتە دابێکی تازە هەرکەس شتێک دەنووسێ دەیکاتە دیاری بۆ کەسێک، منیش ئەم سەرەمەڕەی خۆم پێشکەش بەو کەسە دەکەم کە هەمووی دەخوێنێتەوە و خەڵکیشی لێ تێ دەگەیەنێ .

***

### حیکایەت خوان

شـــــەوێـک لـە شـــــەوی پـایـز
خـــوا لێ خـــۆشـــبـــوو مـــام بـایـز
پـیـــــــرێـکـی دنـیـــــــادیـدە

دانا و زانا و گەڕیدە
قسەڕەوان، گفت جوان
شیرن ڕاوێژی زمان
لە گوێی ئاگری مزگەوت
سەعات گەییە شەش و حەوت
ئەوە دەیگوت: حیکایەت،
خۆش بوو بەدەر لە غایەت
ئاوی گوێچکەی دامەوە
وەهای بۆ گێڕامەوە

## سێ تەنبەڵ

هەبوو نەبوو، لە زوودا
لە دەورانی پێشوودا
سێ زەبەلاحی بێکار
چەورە و شەلاتی ناوشار
دەست و پێ سپی و تەنبەڵ
پیس و بۆگەن و چەپەڵ
یەک لە یەکتر خوێڕیتر
هەر بۆیە بوون یەکدی گر
نانی بە ڕەنجی شانی
هەر ناویان نەدەزانی
بەخواهیش با و بە زۆری
دەژیان بە مفتەخۆری
هەر شەو دەچوونە ماڵێک

سێسەد و شەست لە ساڵێک

سەلام مەلیکم حەمە

میوانی تۆین ئەو جەمە

ئا توخوا پوور خانم جان

تۆزێ کەرە و سێ چوار نان

چبڵا بوو خوشکە ڕابی!

نابێ تۆزێک بۆ خوا بی!

ترخێنێکمان بۆ لێنێ

ئاهی دڵمان بشکێنێ

چەند ساڵێ وا بەڕێ چوون

تا لای خەڵک بۆژۆ بوون

کەس بەربەی نەدەپێوان

ناچار دایانە کێوان

شەوێک لێرە، یەک لەوێ

هەر نانەزگ دەس کەوێ

وا فێربوون مالانگەڕی

سەگیان پێ نەدەوەڕی

هێند چوختی ببوون لە سواڵ

مەلا فڕێی دا مەتاڵ

شێخان لە بەریان بەزین

بەتاڵیان کرد خوانی زین

دێوانە کەوتنە هاوار

سەریان دا لە بەرد و دار

گـوتیـان چیـان بۆمـان نەهێـشت
با بیـانخـۆین لە باتی چێـشت
تەنبـەڵبـاشـیی زەمـانە
ترسـان بیـانخـۆن دێوانە
بـەنـاچـار دایـان بـڕیـار
یەکـجـاری بچنەوە شـار

## شارێکی مەزن

لە کـەلێ وەسـەرکـەوتن
مـاندووبوون، تۆزێک خـەوتن
هەڵسـان نۆڕیانە چواردەور
دنیـای سـامـاڵی بێ هەور
لـە دوور شـارێ دیـارە
پڕ گـومـبـەز و منـارە
پڕ قـەڵا و باڵـەخـانە
عـەجـایبی زەمـانە
نـە سـەری دیـارە نـە بـن
هەزار شـەیتـان دەکـا ون
شـەقـامی هەزار هەزار
ڕاکـشـاون لە گـەرووی مـار
هـەزارە زیـلـەی نـاوشـار
زیـاد لـە ئـەندازە و ژمـار
وەک لەشکری مـەل و مـوور
ڕەش دەچوون دەجـمین لە دوور

تەنبەڵ ماتی دای گرتن
دیتیان تارمایی مردن
چۆن بژین لەو شاری پڕ!
ئێمەی خوێڕی و شڕ و وڕ!
لەبەر زۆر بیرکردنەوە
خەونووچکە دەیبردنەوە
یەک لە هەموان پتر سەگ
پێیان دەگوت قوڵی بەگ
لە پڕ سەری هەڵبڕی
دە ئاوالآن ڕاخوڕی:
سەر بەرەژێر، با بچین
فێڵێک هەیە پێی دەژین
«چۆن فێڵێ؟ شەیتانییە
بەشم لە زۆرزانییە»
لە ڕێگە تێی گەیاندن
لە دڵ و مێشکی چەسپاندن

## ژیان لەو شارە

هاتن، گەیشتنە ناوشار
پێدا گەڕان سەر و خوار
لە هیچ کوێ جێی وا نییە
بێکاری تێدا نییە
نە دەوڵەمەند، نە هەژار
نە گەدایە و نە خونکار

نە زۆردارە و نە بێ زۆر
وەک یەک سپی و ڕەش و بۆر
هەموو کەس دەکا کارێ
چی پەیدابوو ئێوارێ
دێتە ژمار و دەفتەر
دابەش دەکرێ بەقەد سەر
کێ لەکار ئازاتر بێ
دەبێ بەشی زیاتر بێ
هەرکەس کاری نەدەکرد
بێ نان لە برسان دەمرد

## بە میرات نەبوو

ئیتر لە میرات نەبوو
کوڕی خان و خات نەبوو
دەوڵەمەندێک مندار بێ
یەکەم سووتخۆری شار بێ
کوڕی جاشە کەرێ بێ
بێ شەرم و سەرسەری بێ
زمان پیس، دەم بۆگەنیو
بەهۆی لیرەی مام تۆپیو
ببێتە گەورەی کۆمەڵ
کەر دەبەرکا پێستە کەڵ

## بێ ئاغا بوو

لێی نەبووکوڕی ئاغا
شەو بنوێ لە وەتاغا

به ڕۆژ بچێته ڕاوێ
به تاژی و تفەنگ باوێ
ئارەق نەچێتە توێڵی
بژی بە حیزی و دێڵی
تەماح کاتە خێزانی
جوانی ڕەعیەتەکانی
بێ ماندووبوون بێ هەوڵ
بپۆشێ چەکمە و کەوڵ
کەوا و پاتۆڵ، ئەسپی چاک
لە دواڕۆژ بێ ترس و باک
وەک کوردەواری نەبوو
نە بەگ بوو، نە بێگاری
نەک وەکو کوردەواری:
جوتێری دەس قەڵشاوی
بەهەرەی دێم و بەراوی
ئارەقی نێو چاوانی
خۆی و منالەکانی
ساڵ دوازدەمانگ ماندووبوون
دەرکەوێ تاریک و ڕوون
لەبەر بڵێسەی هەتاو
لە دروێنەدا چەماو
بە پشتی کووڕ هەتا شەو
تا لا بە لای دەخەو
مناڵ هەر یەک گوێی کارێ

بگرێ هەتا ئێواری
نە خوێندنگا و نە دەرمان
چاویان پڕووش لە گەرمان
بێ جلک و بەرگ و پێلاو
لە ئەسپێ و کێچا خوراو
ڕووت و قووت تەواوی سالّ
نانیان جۆ و زوڕات و گالّ
زستان لەرزیو بێ ئاگر
لەوان جێ خۆشتر مامر
گەنم و تووتن پەیدا بێ
هەرگیز دەنکیان بۆ نابێ
پێک هاتووی سالّ بە خڕی
بۆ ئاغا و ژن و کوڕی
ئاغا بیکاتە قومار
خانم خەرجی کا لە یار
کوڕ بکڕێ جلە تاژی
جەیران لە سەرمان ناژی
نە شێخ نە تەکیە هەبوو
نە دەروێش و حاوو حوو
نە دێوانەی ئاگرخۆر
نە سۆفی چڵکن و بۆر

**ئەدی چۆن بوو ؟**

هەموو کەس پاک و خاوێن
هەڵکراو چاک و داوێن

نە زیندان بوو لەو شارە
نە کوشتن، نە قەنارە
نەجویندان، نە هەرا و شەڕ
نە فێڵ و فەرەج  نە گەڕ
نە دزی و نە گیرفان بڕی
نە کینە و نە دڵ پڕی
نە هەتیوی کۆڵانگەڕ
نە سیلداری چرچ و لەڕ
نە ژنی برسی و بێچارە
ئابڕووی بدا بە پارە
دەرمانگە و نەخۆشخانە
زیاد لە پێویست هەیانە
مناڵ کە تازە دەبوو
کۆمەڵ دایک و بابی بوو
دایک دەچووە زانگەوە
بە زگی هەشت مانگەوە
مامانی ژیر و زانا
یاریکار بوون لە زانا
نێوک بڕین، فرچک دان
دەیکرد بژیشکی چازان
دەیان کوتان بێ بەرتیل
بۆ ئاوڵە و چاقوڵکە و سیل
تا لە زانگا دەترازا

دەبوو بە گوێزی ئازا
دایک سێ مانگ وچانی
دەدرایە دەوری زانی
کێ مناڵی زیاتر بوو
لەویتر بێ خەمتر بوو
لە سێ مناڵ بەولاوە
بەراتی بۆ دەبڕاوە
کێ دە مناڵی بوایە
مووچەیەکیان دەدایە
باب و دایکی پێ دەژیان
خەنی دەبوون لە خۆشیان
تەمەن ببا پەنجا ساڵ
پاڵی دەداوە لە ماڵ
ژینی بەڕێوە دەچوو
هەر شارنەبوو، بەهەشت بوو
تەنیا عەیبێکی هەبوو
زۆر خوێندنی لێ نەبوو
لە بەر زۆر عاشقەکاری
کەمتر بوو خوێندەواری
هەتا دوو سێ پۆل، مناڵ
دەیخوێند و دەچۆوە ماڵ
چەند لاویان هەڵدەبژاردن
بۆ لاوەیان دەناردن

بچن بژیشکی فێربن
نە دەزانرا کە خوێندن
بۆ ژیان و کار بژیوە
کار بێ خوێندن هەتیوە
نەیاندەزانی هەرکەس
کەم بخوێنێ و بڵێ، بەس
ڕەنگە فێڵی لێ بکرێ
نیزیکە فریو بدرێ
بێجگە لە زۆر زانستی
نەیان بوو پێداویستی
نە دەرد و خەم نە کزی
نە لە ژیان وەڕەزی
کار کە نەدەما ئێوار
لەهەموو سوقاقی شار
دەنگی مووزیک بەرز بوو
مووزیک هەزار تەرز بوو
دەبوو بە بەزم و سەما
جێگای کزی نەدەما
قاقای لاوان و پیران
خەمیان دەدا بەر شیران
تا نیوەشەو کوڕ و کاڵ
دەچوونەوە بەرەو ماڵ
لە خانووی خۆش و گەرما

لە نوێنی پاک و نەرما
لێی دەردەکەوتن بێهۆش
دەیان دیت سەد خەونی خۆش
کێ بێ ئەو دەورە تێک دات
هەر دەخەونیش نەدەهات

## کۆشکی بلوورین

تەنبەڵ بە شارا گەڕان
دەڕۆین و دەیان نەڕان:
ئای لەو شارە چەند پیسە
ئای بەختو چەند نەگریسە؟
شاری وا ئابڕوو چوونە
نە جێی ژین و لێ بوونە
کێ بیستی لە ڕووی زەمین
شار بێ کۆشکی بلوورین!
کۆشکی بلوورین کوانێ!
ئەوە بۆ کەس نایزانێ!
وێران بێ ئەم وەڵاتە
بێ بلوورین قەڵاتە
وایان بە قەو دەقیژاند
حەشاماتیان هارووژاند

## بۆچی باشە؟

خەڵک بە سوڕمانەوە
وەرامیان دەدانەوە:

بۆچییـــــه ئەو کـــۆشکە بۆ شـــار؟
خـــۆ نه ئاشـــه و نه عـــەنبـــار
نـه بـەرگـــــــه، نـه نـان، نـه ئـاو
نـه جـــــاو، نه دراو، نـه پـێـــــڵاو

## بەرزیی گیانی

تـەنبـــــــەڵ بـه قـــــــاوو بـه قـین
هەر پـێـــــیـــــان پـێ دەکـــــەنین:
ئـەی خـــــــەڵـکـینـەی هـیـچ نـەدیـو
نـا نـەجـــیـب، هەتیـــو مـــەتیـــو
هـــــەر نــــان و ئـــاو دەزانـــــن
هەمـــــوو بەنـدەی زگـــــتـــــانـن
پـێـــــــتـــــــان وایـه: بـەڕێ چوون
هەبێ، هـەمـــــــوو شـت بـه تـوون
نـەجـــیـــبی و بـەرزی گـــیـــانی
هـەر مـــــــــەعـنـاتـان نـەزانـی!
کــــــوێ بێ کـــــــۆشکی بـلـووره
له ڕەحـــــمــــــەتی خــــوا دووره
گـــــەپـجـــــاڕی شـــــاری دیـکەن
بۆ گـــاڵتـــەجـــاڕ حـــەنتـــیکەن
وا بـار دەکــــــــــەیـن لـه لاتـان
ڕوو دەکــــــــــــەیـنـه وڵاتـان
لـەو جـــــــــێی بـەڕێـوو جێ بێ
کــــــــــۆشـکی بـلـووری لـێ بێ

ئەم باسە دەکەین بە قاو
ئابڕووتان دەچێ تەواو
لە ناو گەلان شەرمەزار
دەبن و دەکەونە بەر زار

## شەندە و مەندە

خەڵکی شار بیستیان ئەمە
کەوتنە چپە و هەمهەمە
لاوان گوتیان هەر ئێستە
کۆشکی بلوور پێویستە
کارمان بێ کۆشک گەندە
کەم نییە شەندە لە مەندە
چۆن خەڵکی تر هەیانە
لە چاو ئەوان چمانە!
ئابڕووی شاری خۆ نابەین
دەبێ ئەم شەرمە لابەین
کۆشکی بلوور لە شارا
وەک خاڵە لەڕووی یارا
پیریش گوتیان کەوابێ
بش بێ زیانی نابێ

## شوانی ناخوازن؟

ڕوویان کردە سێ تەنبەڵ
نەک سێ تەنبەڵ، سێ دەغەڵ
وتیان ئەی پیاوی زانا

ئەی لە عەقڵا توانا
وەک لە دەردان دەزانن
هەر بۆخۆشتان دەرمانن
کۆشکی بلوورین چییە؟
زانستیمان پێی نییە
دە ئێوە تەشریفتان بێن
بۆمان دانێن: ڕێوو شوێن
لەنگۆ بیر و لەمە کار
لەم شەرمە ببین ڕزگار
«بەگورگیان گوت ببە شوان
دای دایە قولپی گریان»
«وتیان: گورگە دەگری، بۆ؟
وتی: دەترسم لە درۆ»
تەنبەڵیش گوتیان: حەی حەی
جا ئەوە چۆن دەکرێ و کەی؟
ناتوانین لێرە گیر بین
لەناو شووشەدا پیر بین
گەڕیدەیی و شارەو شار
لامان خۆشترە لە کار
خەڵکە سەریان گەرم بوو
دڵڕەقیش دڵنەرم بوو
لێیان دەپاڕانەوە
دڵخۆشییان دەدانەوە!

وتیان سا سوێندو ئەدەین
بیکەن هەرچی پێو دەکەین
گوتیان سوێندو بۆ دەخۆین
چۆن دەڵێن: وا ڕێ دەڕۆین

## قوڵی ئەو قوڵی نەما

قوڵی بەگی چەنبەری
تەپڵێکی نا سەر سەری
کلکە ڕێویەکی تێ خست
سێ چوار شیشۆقەی وێخست
فەرەجییەکی پان و پۆڕ
گوڵینگەی پێدا کرد شۆڕ
پێنج شەش زریزە و زنجیر
لە فەرەنجی کردن گیر
سمێڵی لێ کردن قیت
چاو بە چاویلکە بوون زیت
پانتۆڵێکی دەلینگ فش
دەق نەشکاوو خشەخش
مامزە و چەکمە و جیڕە جیڕ
هەرا و قیڕە و شیڕە شیڕ
هەروا بەم فاک و فیکە
بوو بە پیاوێکی دیکە
بە هەیبەت و مەترسی
جێگیر بوو لەسەر کورسی

## تەنبەڵی دووهەم

دووهەم تـەنبـــــەڵیـــــان هێنـا
ڕیـــشـــێ درێـــژیـــان لـــێ نـــا
چاویان ڕشت بە کل و کلتـــــوور
دەپێی کـــرد ئێـــمـــەنی ســـوور
تـەزبـیـــــــــحێ هـەزار دانـە
دە ملیـــان کـــرد شـــێـــخـــانە
لە ســـەریان بەست شـــاڵی شین
ناویان نا شـــێخ مـــحـــیـــەدین
وا لـەبـەر چـاو زل بـبـــــــــوو
پـیـــــــاو زەنـدەقـی لـێی دەچـوو

## هاواڵەکەی تر

سێ هەمـــیـــان بە ڕووخـــۆشی
بـەرگـــــــێـکـی ڕەشـی پـۆشـی
سێ چوکـــڵـــەی حـــیلە بازان
نـــاویـــان لـــێ نـــابـــوو: چـــازان
جل تـا بـڵـــــێی فش و فـــــۆڵ
سێ چوار گـــەز کـــرابووە قـــۆڵ
کـــــڵاوێـک لەســـــەر ســـــەری
کـــــــــڵاوی چـی! لـەنـگـەری!
وەکـــو گـــوێی کـــەری جـــڕجـــاڵ
ســـێـــبـــەری بۆ پێنج ســـەد مـــاڵ
کـــــــەوشی بـریـقـــــــــەداری
ڕەوتـی بـە لـەنجـــــــــە و لاری

قـــــەڵـەمـێ زل لـەســــــەر دڵ
کـــتـــێـــبـــێک لەبـن هەنگڵ
تـا بـزانـن ئـەم ئـاغـــــاشـــــە
قـــانوون ڕێـکخـــەری باشـــە

## یاسای تازە

ئاڵـقـــەی یـاســـا تێک خـــرا
زنجـــیـــر بۆ گـــەل ڕێک خـــرا
یەک: ئەو کـــۆشکەی ســـاز دەبێ
پـڕ لـە خــــــۆشـی و نـاز دەبـێ
کــــــــۆشـکـی بـلـوورە بـەنـاو
پـێی هـەڵـمـــەکـــاڵێـن بەچاو
دوو: هەرکـــەس پێی بڵێ خـــوار
یـان جـــــوێـن دا بـە بـەرد و دار
یـان لـێی کـــار نـەکـــا بـە دڵ
یـان لــە بـێـگـار بـکـا سـڵ
دەکـــوژرێ لـە دنـیـــای ڕوون
لە قـیـامـەتـیـشـە مـەلعـوون
سێ: هـەرکـــەس لـە زۆر و کـــەم
لـــێـــی داوا بــکــرێ هــەردەم
نـەیـدات بـۆ کـــــۆشـکـی بـلـوور
دەکـــوژرێ بەپێی دەســـتـــوور

## کار لە کۆشک

دەس کـــرا بە کـــار ئەمـــجـــار
لە خـۆشـتـر مـەڵبـەندی شـار

هەزار خانوو تێک درا
بنگەی کۆشک ڕۆ نرا
بەهەزاران کارگەر
لە حەد بەدەر بارەبەر
ڕەمڵ و بەرد و قوڕ دێنن
بناغە دامەزرێنن
چی پشتە و عەرەبانە
لە کەرستە کێشانە
موهەندیس و میعماران
دەس ڕەنگین، شیرن کاران
دەستیان دا دەس کارگەر
بناغەیان بردە سەر
بە بلووری تواوە
پایە بەرز کراوە
هەرچی دارتاشی باشن
وا پەنجەران دەتاشن
چەند ئاسنگەر پێویستە
نێونووس کران لە لیستە
هاتن تەونگەرباشان
چنیان قاڵیچەی کاشان
نان و پێخۆری پیاوان
لەسەر هەتا بناوان
ماست و ڕۆن، گۆشت و پڵاو

قـــاوه و چایی بـه لێـــشـــاو
دەبوو بیـــدەن خـــەڵکی شـــار
بـه تـۆن، بـه بـار، بـه خـــــەڵوار
زۆریـان لات هـەڵبـــــــژاردن
ســەر کــاریـیــان پێ ســپــاردن
زۆر خـــوێڕی و پەست و بێ هەست
بـــۆیـــان بـــوونـــه داری دەســـت
خـــەڵکیـــان لە بێگاردا کـــوشت
تا نـهـــۆمـــێـکیـــان دارشت

## وتاری قولی بەگ

سێ تـەنـبـــــەڵ چـوونـه نـاوی
ڕۆژی حــــــەفـلـەی تـەواوی
خـــوتبـــەی بـۆدان قـــولی بەگ
کـــه ئەی گـــەلی بە ئەمـــەگ
ئـەی پـالـەوانـانـی کـــــــار
ئەی ڕەنجـــــدەرانی هێـــزدار
نـهـــۆمـــێکتـــان تەواو کـــرد
نـاوبـانـگی خـــۆو بـلاوکـــــرد
عـــافـــەریم ســـەد عـــافـــەریم
ئـەوی مـن لـە ئـێـــــــوه دیم
بـەهـیـچ کـــــەس وا نـاکـــرێ
کـــەس وا بـەرگـــه نـاگـــرێ
بەڵام نهـــۆمـــێک چیـــیـــه!

شایستەی شارتان نییە
لەسەرمان پێویستە زوو
تەواو کەین نهۆمی دوو
ئەوی ئێستاش هەمانە
بیپارێزین مەردانە
جا قەزاو لە گیانی من
بەخۆ خۆش مەکەن دوژمن
کێ دارا یان نەدارە
تەقسیر نەکا لە پارە
ماڵی دنیا هیچ نییە
نێوی چاک ئەبەدییە
کێ ئازایە کار بکا
کاری بەرد و دار بکا
فکری باشمان بۆ کردوون
میداڵمان بۆ داڕژتوون
لە زێڕو زێوی ئێوە
وێنەی خۆمی وا پێوە
کێ زۆر ئازا و گوێگر بێ
کێ پیتاکی پتر بێ
نیشانێکی دەدەینێ
دەی چاوم، هەر سبەینێ
دەست پێ کەین، دووەم نهۆم
لەمنو کەوێ کوڕی خۆم

ئەگــــینا کـــــارمـــــان لەنگە
لە قـــاتێک جــێـــمـــان تەنگە

فەرموودەی شێخ

ئەم جـــــارە شـــــێخ ڕدێن زل
دەم بــــۆز و چـــاو پـــڕ لـــەکـــل
ســـــــەرشین وەکـــــــو دارە بی
پاش چەند وشـــــەی عـــــارەبی
فــــەرمـــــووی کــــۆمـــــەڵ بزانن
ئەگـــــەر خـــــاوەن ئیـــمـــــانن
دەبێ ئەم کـــۆشکە ســـازکـــەن
ئێـــمـــــە لەخـــەم دەرباز کـــەن
هەرکـــــەس بۆ قـــــاتی دوایی
کــــــــــار بکا بە ئازایی
مـــاڵی خـــۆی پێ ببـــەخـــشێ
هەر تا کـــــۆشک بنەخـــــشێ
لەو دنیــــــا پاش مـــــــردنێ
حـــەفـــتـــا کـــۆشکی دەدەنێ
حـــەفـــتـــا حـــۆرییـــان تێـــدایە
هەر یەک نرخی دنیـــــــایە
کێ نانی خـــــــۆ و مناڵی
مـــــافــــووری چاک و قـــــاڵی
بێنێ بۆ ئێــمـــــە، بیـــخـــۆین
ڕایخـــــەین، لە ســـــەری بڕۆین
لەناو بەهەشـــــــتی بەرین

تێر دەخوا شیر و هەنگوین
کێ لە دنیا فەقیرە
لاتە و کزە و زویرە
کێ زۆر پیس و چڵکن بێ
ئەسپێون و ڕشکن بێ
لە قیامەت زۆر لە پێشە
بەهەشت خانی دەروێشە
گەر دەڵێن: تۆ بۆ وانی؟
بۆ وا خاوێن و جوانی؟
حیسابی من جیاوازە
شێخ لای خوا کاری سازە
ئێوە زاهیر دەڕوانن
لە باتین چ دەزانن!
ئێمەی زاهیر داپۆشراو
باتین بێ دەرپێین تەواو
بە زاهیر کە نانخۆرین
بە باتین هەزار جۆرین
ژنمان دەبێن جوانە
سەر سوورە و بن هەمبانە
جا لەمنو کەوێ کوڕگەل
بۆ ڕێی خێر هەڵکەوت هەل
دەس پێ بکەن زۆر مەردانە
خودا و شێخ لەگەڵتانە

## یاسا دیسان

ڕەشپۆشی یاسا ڕێکخەر
ئەمجار هاتە سەر مینبەر
گوتی: قانوون ئەفەرموێ
هەرکەس هەیە و لە هەرکوێ
با بێنن بۆ کۆشکی چاک
نوێن و پۆشاک و خۆراک
برنج و ڕۆن و کووتاڵ
گیسک و کاوڕ و پووڵ و ماڵ
چی لە بەرد نەرمتر بێ
لە بەفر گەرمتر بێ
کۆشکیش دەبێ وەرگرێ
نەهێنێتە بەر گرێ
کێ بە کار و ئازایە
ناشێ خۆ بداتە دوایە
ماندووبێ تا دەتوانێ
خۆی بە ماندوو نەزانێ
با بخوا هەرزن و جۆ
پێخۆر، ئاو، گەر نەبوو دۆ
بسازێنێ بە بەشی
تووش نابێ چارەڕەشی
کێش بێ شەرمە و بێ کارە
تەن پەروەر و نازدارە

گوێ ناداتە عەیب و عار
وەک نیسکە بێ پشت و بار
لە ڕێگەی چەند قرۆشێ
حەیا و شەرەف دەفرۆشێ
زۆر قەڵب و تەوەزەلە
بێتە لامان بە پەلە
بەخێویان دەکەین زۆر باش
دەبنە گزیر و سوور باش
دەستیان دەگەڵ دەستی مە
پێک بێن مەبەستی مە
کارمان بە ئی وا زۆرە
دار ناقەڵشێ بێ هۆرە

## دڵخۆشکەرە

ئازادن بە پێی قانوون
ئای چەند خۆشە ئازاد بوون!
ئەگەر دەمرن لە برسان
یان دەتۆقن لە ترسان
سواڵ کەن زەلیل و زەبوون
شەو لەبن پردان بنوون
کەس هەقی نییە لە سەرتان
قانوون بووەتە لەمپەرتان
ژن کە برسی و بێ نانە
دەچێتە قەحبەخانە

بۆ نانێ خۆی دەفرۆشێ
دەرد و زووخاو دەنۆشێ
گەواد ئازادە بیکرێ
لێ یدا، بکوژێ، ببڕێ
بە منداڵو نەخوێنن
یان باش نەیان عاملێنن
یان بەبێ دەرمان بمرن
یان قەت ڕێی چاکە نەگرن
دەتوانن، چونکە قانوون
ئەو ڕێگەی باش کردووە ڕوون
کێ فێڵباز بێ لە ناوتان
بدزێ زێڕ و دراوتان
بە سووتخۆری و شیربایی
بە تاجری و ئاغایی
یان بە شێخی و دەروێشی
بە مارگری و بەنگ کێشی
یان بە سواڵ و سەدەقە
بە قانوون خاوەن هەقە
کێ لێمان بێت ناڕازی
دەس کا بە چەنە بازی
لە سەر هەژار بێتە جواو
بۆی بخوازێ نان و ئاو
کار و پێڵاوو پۆشاک

خانووی خاوێن و ڕووناک
نەخۆشخانە داواکات
بۆ چاری دەرد هەراکات
بێژێ خوێندن پێویستە
ئەو کەسە کمۆنیستە
بە قانوون گوناهبارە
جەزای حەپسە و سێدارە
لە شەرعیشدا کافرە
جێگای لەناو ئاگرە
قانوون دیموکراتییە
شتی وا باش هەر نییە
لە ڕۆژهەڵات بەولاوە
هەر ئەم قانوونە باوە
خۆم بەختەوەر دەزانم
ڕێکخەری قانوونتانم
جا ئەی کۆمەڵی ئازاد
ئەی دڵشاد بە عەدل و داد
لە سایەی ئەم قانوونە
ئێستا ڕۆژی یەکبوونە
مل لێنێن ئازا و جەسوور
تەواوکەن کۆشکی بلوور
زووی تێدا ڕۆبنیشین
کە زانیمان بێ ئیشین

ئەوسا خۆشی لە خۆتان
قانوون زۆر دەکرێ بۆتان
هێندەو بۆ درێژ دەبێ
سەرتان تێدا گێژ دەبێ

## کارداری کۆشک

کێ لە هەر کوێ تەنبەڵ بوو
لە پیاوەتی پووچەڵ بوو
کێ کەیفی لە کار نەبوو
بە هیچ شەرمەزار نەبوو
ڕووی لە کۆشکی زل دەکرد
دادەمەزرا دەست و برد
بوونە کارداری خونکار
کوتەکی دەستی زۆردار
زۆر خۆشیان هاتە بەرچاو
بێ ماندوو بوون نان و ئاو
بوون بە سێ بەش ئەوانە
کامەی تەنبەڵتریانە
دەبەریان کرد کەوای شۆڕ
زل و سەوز سەر و پۆڕ
تا بۆ کار خەڵکی هان دەن
کۆشکیش قایم نیشان دەن
ناموس و دین پێخوست کەن
بەدرۆ حەدیس دروست کەن

بەرنە مێشکی حەشامەت
کە تا ڕۆژی قیامەت
ئەو کۆشکە هەر دەمێنێ
هیچ هێزێک نای ڕووخێنێ
کێ بیرکات لە ڕمانی
دەمرێ بەبێ ئیمانی
لەوی زۆر سەگ و زۆرزان
کۆنە چەکمەڕەق و خان
دەستێکیان گل دانەوە
هەر لە کۆشکا مانەوە
چی ملهووڕ و ئەحمەق بوون
بێ مێشک و کەللەڕەق بوون
زۆڵ و دەسبڕ و چاوشۆڕ
ڕووناخۆش و مچ و مۆڕ
زمان شڕ و داوێن پیس
بوونە چەکدار و پۆلیس
قایش و قرۆش جل و بەڕ
شیر و خەنجەر و وەڕ وەڕ
وایان لە خۆیان دەکرد
زراوی خەڵکیان دەبرد
هەرچی کۆشک دەیفەرموو
جێبەجێیان دەکرد زوو
زیندانیان دروست کردن

جێگای ڕزین و مردن
تا هەر کەس بۆیان نەلوێ
جێگەی هەبێ لێی بنوێ
پیتاکێکیان کە دەستاند
پشتی باجدەریان دەشکاند
دراو بۆ کۆشک چەندە
بۆخۆشیان دوو ئەوەندە
هەرکەس گوتبای وا نابێ
دەبوو ماڵی خرابێ
دەڕزێنرا لە زیندانان
دەکرا بە تۆزی بانان

## دەس کرایەوە بەکار

سەر لە نوێ خەڵکی ناوشار
چوونە ژێر بار و بێگار
جاران کە بە نەرمی بوو
ئەوجار بەبێ شەرمی بوو
کار دەکرا بە کوتەک و جوێن
ئارەق تێکەڵ بوو بە خوێن
گەلێک پۆلیس و چاوەش
لە سەر فەعلان کرا بەش
هێندێک دەچوونە بازاڕ
لە ناو خەڵکیان دەدا جاڕ
زووبن نان و جل بێنن

خێراکەن، ڕامەمێنن
گۆشت و هێلکە و شیر و ڕۆن
تووتن و پەڕ و عەتر و بۆن
ماش، برنج، نۆک و نیسک
بزن و مەڕ، کار و گیسک
خەڵکی کۆشکیش هێندینگۆن
زۆریان دەوێ تێر بخۆن
کۆمەڵ گش تیرە و گەلی
کەوتە سەر ساجی عەلی
نەما بیخۆن توند و شل
غەیری سوێند بە کۆشکی زل

## ترِی خوسرەو

ئەو کۆمەڵە هەژارە
ڕزگار دەبوون لەو کارە
کارێ تر دەیگرت جڵەو
ببوو بە ترِی خوسرەو
بێگار هەر نەدەبڕاوە
هەر لەو کۆشکە گلاوە
بە دوان ڕانەوەستا کار
نۆم بوو بە سێ و چوار
هەمووش هەر جمەی دەهات
لەبەر زۆری حەشامات
گشتی نانخۆری تەنبەڵ

ڕژد و چنۆک، بە گێچەڵ
هەرواش زۆر دەبوون خوێڕی
خوا وەخێری نەگێڕی

## نەدەترسان

دانیشتووی ئەو سەرایە
لە گاڵتە و گەپ و کایە
لە خواردنەوە و لە مەستی
لەبەر شەهوەت پەرستی
لە بیری ژیان خۆشی
کەوتنە بیری بێ هۆشی
فکریان نەدەکرد جارێ
هە یاران خەڵکی شارێ
نان و ئاومان لەسەریان
جلمان داکەند لەبەریان
پاروومان لێ ڕفاندن
ئێسکیشمان لێ کڕاندن
ئاخر جارێک، ئاوڕێک
لە هەزار مەڕ کاوڕێک
شتێکیان بدەینەوە
بیرێکیان لێ بکەینەوە
پیاو مانگایەک دەدۆشێ
شیر و ڕۆنی دەفرۆشێ
دەیسپێرێ بە گاوان

بیباتە مێرگی پاوان
بە دار لێی نادا بە قەو
دەیباتە تەویلە شەو
لە ترسی قوڕن و، گەنەی
دەدۆزێ کلک و چەنەی
هەر بکۆخێ لەسەرمان
دەیگاتە سەر بە دەرمان
تاژییەکی هەیە بۆ ڕاو
لەبەر خەو چاو هەڵمساو
کلک لە گەڵۆز، بۆگەن
نان بێن بۆ سەی ڕەسەن
تا پایز بەخێو دەکرێ
کەروێشکێ بگرێ و نەگرێ
بەڵام مسکێنی هەژار
پۆڵای پاڵەوان لە کار
ئارەق ڕژێن و جووتکەر
داس وەشێن و ڕەنج بەر
بەننا و جۆڵای کوتاڵ چن
فیتەری پۆڵا و ئاسن
لەسەر هێزی کارگەر
زەوی گرتوویە لەنگەر
چۆن وەک سەگی نەزانن!
وەک مانگای لێ نەڕوانن!

ناترسن ئەو عیفریتە
ئەو سەر مەڕی چاو زیتە
ڕۆژێک لێیان ڕاپەڕێ
تەخت و بەختیان وەرگەڕێ
کاتێ پێوانە پڕ بێ
بیکەیە سەر لێی دەڕژێ
لەوێش پێوانە پڕبوو
خەڵکی شار حاڵیان شڕبوو
پیاو هەتا دەوڵەمەندە
ترسەنۆکە و دەربەندە
دەترسێ تالان بکرێ
قەرزی لای خەڵک بوخرێ
نەوەک موڵکی لێ ببڕن
زگی گامێشی بدڕن
بەڵام هیچت نەمێنێ
کێیە چت لێ بستێنێ!

## بەزمی ڕووتی

دەڵێن هۆلاکۆ جارێک
دەچێتە دەوری شارێک
دەڵێ لە چووک و گەورە
هەر کەس پێو وایە چەورە
دە لیرەی لێ بستێنن
دڵی هەژار مەشکێنن

لە بنەوە ناردی پیاوێ

لەشار بگێڕێ چاوێ

دێتەوە دەڵێ: ئاغام

تەواو بە شارا گەڕام

باجدەر بار لەسەر لێون

ئی زۆر زل قوڕ دەپێون

دەڵێ کێ بۆتە حاجی

هەزار لیرەیە باجی

کێ لەوان نەوی ترن

خۆو ئەندازەی بگرن

نامەوێ چیان بمێنێ.

جاسووس خەبەرێ دێنێ:

خەڵک کەمیان وەڕەزن

هەر حاجین تۆزێک کزن.

دەڵێ: حاجییان تالان کەن

جا وەرن بۆم بەیان کەن.

جاسووس دێ بە پێکەنین

کە ئەی خانی سەر زەمین

بەزمێکە بەڵام بەزم

کەس نەما بڵێ ئەزم

کەس ئاگای لە کەس نییە

فەرقی شێخ و قەس نییە

تێک هەڵدانە و شەڕەشەق

چرە و گوڕە و چەقەچەق
هەڵپەرکێیە سێ جرتی
سەرچۆپی حاجی گرتی
قازی گۆرانییان دەڵێ
مەلێ و مەمۆ و سەوزەڵێ
خانی وشیار و زانا
بلیمەت لە جیهانا
دەڵێ: نامە با ڕاکەین
شارێکی تر پەیا کەین
بەزم بەزمی ڕووتییە
هەڵپەڕکێی نابووتییە
چیان نەما لێی بترسن
وا لە خۆشیان دەڕەقسن
بێنە سەرمان ئەمانە
ڕووت ئاگری بێ ئەمانە
قەت یەکێکمان ناهێڵن
زووکەن بەجێیان بێڵن

## سمێڵ دانان

وا لێرەش خەڵکی شاری
کەوتنە بەزمی هەژاری
هێندەی ماڵیان خورابوو
هێندەش ترسیان نەمابوو
ڕۆژێک لە کۆشکی بلوور

دەستوور درا بە مەعموور
ئەویش تێی هاڵاندن گەڕ
دەبێ بێنن سەرو مەڕ
وردە و پیر و هەرزەکار
چیان هەبوو دار و نەدار
دوامین قۆشەی هەیانە
بردیان بۆ تەنبەڵخانە
وتیان: ئاخر کوا ئینساف!
تالآن کراین ساف لە ساف!
گوتمان کۆشکی بلووری
زۆر شتێکە زەرووری
خۆ نەمان گوت هەزاران
لە تەنبەڵ و بێکاران
ببنە نانخۆری بێ ئیش
سمێڵمان نایە سەر ڕیش
پێمان ناڵێن چین ئەوە؟
بۆ کوێ دەچین هەر هەوە
قووتوودا کولآو و کاڵ
زگتان تێرە یان جەواڵ؟
ئەو هەمووەی دەکوێ دەنێن
کای ئێمەیە، ئەی کادین؟

## کلکە لەقە

قولی بەگی عەنتیکە
زانی بەلا نزیکە

بەســـەد قـــانوونی ڕەشـــپـــۆش
ئاگـــرێکە نابێ خـــامـــۆش
بـە زۆری دانـامـــــــــــرێ
بـە بـێ نـەرمـی نـاکـــــــرێ
بـۆی کـــــەوتـە کـلـکـە لـەقـــــە
وتـی چـی دەڵـێـن هـەقـــــــە
فـەرمـوون، فـەرمـوون وەرنە ژوور
ببـــــینن کـــــۆشکی بلوور
دیموکـــــــــراتـی دەنـوێـنـم
ڕەعــــیــــەتی خــــۆم دەدوێنم
هەقـــتــــان هەیە بپـــرسن
داوای جــواب کـــەن، مـــەترسن!

## کوێرا زۆر بوون؟

وتیـــــان: ئەی خـــاوەن شکۆ
گـــــەر گـــــران نایە لە تۆ
بێـــــژە ئەو کـــــۆشکی وا زۆر
چۆن وا پڕبوو لە نانخـــــۆر؟
چلۆن ڕیشـــەی مـــەو کـــێـــشـــا
ئاخـــر ئێـــوە لە پێـــشـــا
سێ کـــەس بوون، هاتن پێـــرار
کـــــوێرا بوونە سێ هەزار؟

## بە گۆڵمەز فێرە

گـــــوتی: ئۆ... ئەی کـــــوڕانم
وەرامـــــتـــــان باش دەزانم

من زۆر بە گوڵمەز فێرم
وەرن بۆتان بژمێرم
ئەم ساڵۆنە زەلامە
بۆ ڕۆنیشتن جێگامە
ئەو ژوورە لێی دەخۆم نان
ئەوەش بۆ قەننە کێشان
دیوی قاوەیە ئەوە
ئەوەش جێی چێشتە خەوە
هۆوەش حەرەمسەرایە
سەد ژنێکی تێدایە
عەیبە گوتەنیش، ئەوان
بۆ بەزم و گاڵتەی شەوان
بە ڕۆژ لە کاری ئێوەم
شەویش تا ڕۆژ لەو نێوەم
ئەم ئەفەندییەی وا قۆزە
وا بە دەعیە و بە پۆزە
کۆمەگم دەکا بە بیر
نێوم لێ ناوە ئەمیر
ئەوەش کۆمەگە بۆ ئەم
خۆتان ببژێرن سەرجەم
سی چل گۆمەگ بۆ کۆمەگ
هەمووی خان و ئاغا و بەگ!
ئەمیان قاوەچی خۆمە

بـەگــــــزادەیـە... نـە دۆمـــــــە
ئـەوەش کـــــــۆمـــــەگـی ئـەوە
وەک هـی پـێـــشــــوو بیــــرکـــەوە
دە کـــــــــەس چـرا هـەڵـکـەرە
چـل کــــەس گــــەسک لـێ دەرە
پێنج شـەش کـەس مـێش دەکـوژن
جلشــــۆرمـــان بیـــست و دوو ژن
دە کـــــەس بـاوەشـــــێنـکـەرمـن
چل پـەنجـــا چێــشت لێنـەرمـن
لـەو خـــــــەڵـکـە سێ یـا چـواری
لـە گـــــەڵـمـــا دەکـــــەن یـاری
پـەڕ و شـــــەترنج و تـەخـــــتـــــە
دەردی بێـکاری ســـەخـــتـــــە
بـەچـی وەخـــــــــــتم ڕابـوێـرم
یـاری لـەمـــــێـــــژە فـــــێــــرم
شــەش حـەوتێک قـــســەخـۆشن
جــــەفـــــەنـگم پێ دەفــــرۆشن
دوو سێ کـەســیـان شـاعــیـرن
زۆر خـــــۆوێـژی مــــاهـیـــــرن
بـە درۆی قـــــــەڵـەوو پـتـــــەو
پـێـم هـەڵـدەڵـێـن ڕۆژ و شـــــەو
هـێـنـدەم پـێ هـەڵـگـوتـراوە
خـــــۆم لـە خـــــۆم لێ گــــۆڕاوە

چەند کەسێک سەگەوانن
زۆر باشی لێ دەزانن
تاژییەکانم زۆر باشن
لە نان خواردن وەک ئاشن
چنگ درێژ، ناو دەست بڵاو
هەتا بڵێین خێران لە ڕاو
هەڵۆ هەش نۆ جاری کوشت
کەروێشکی سیخوار لە پشت
ڕێوی ڕاوکرد لە کێوی
بە خوای فێڵبازە ڕێوی
ئەوی لەو ژوورەتان دین
هەموویان ڕۆژنامەچین
نووسین بە پووڵ دەفرۆشن
عەیب و عارمان دەپۆشن
هەرچی بیکەم، زۆر و کەم
بنووم، بخۆم، دەبەرکەم
چی بێ تامە ببێژم
یاخۆ بشکێ دەسنوێژم
چۆن ڕێک و پێک و جوانە
بۆم دەنووسن ئەمانە
دنیای بەبێ ڕۆژنامە
ژیانێکی حەرامە
مەیتەریش ئەو چل کەسەن

ئەسپم هەن هەمووی ڕەسەن
زگ تێڕ و دەم دەستاڕن
لە پەستا جۆ دەهاڕن
لە گرێوە ئەسپا تاقن
درێژن، لەسەر لاقن
هەر ئەسپێ پێشیان کەوێ
زەوتی دەکەم هەر لەوێ
ئەمەش خواجەی حەرەمە
تا چاکەی بڵێم کەمە
ئاگای لە ژن و ماڵ دەبێ
تووشی سەد ئۆباڵ دەبێ
چەند لاوێکی بە دەستە
پشتی خۆتیان پێ بەستە
ئەو سەر بێ تووکە و دیوە؟
بنان گوێی دەرپەڕیوە
زگ زەلامە و مل ئەستوور
چەنە کورت و لووت شەیپوور
زۆر وشیار و بە هەستە
دە نووسەری بەدەستە
ڕەئیسی باج گرانە
ئەرکیان زۆر لەسەر شانە
چی ئێوە دەیدەن بەمە
هەر چەند برێکیش کەمە

دەنووسرێ هەر لە ڕێوە
چۆن خوا هەڵدەگرێ، ئێوە
باوەڕیتان بە من بێ
بێڵم هیچتان لێ ون بێ!
ئەم پیرەش سەر بژیشکە
مەیدوێن: کەللە ویشکە
لە هەندەران هێنامان
دەستی منتان بە دامان
زۆر لەلای ڕامەوەستن
گەلێک شتی بە دەستن
ئەو تاقمەش مۆسیقارن
هەڵبژێراوی شارن
بلویر ژەن و قام بێژن
ئینشاڵڵا ڕۆژی جێژن
کە زۆر بێن جێژنانە
زۆر گوێ دەگرن لەمانە
ئەو ئاغایەش ڕەئیسە
یانی سەرەک پۆلیسە
ئێوە خۆتان دەزانن
زۆر کەس زۆر بێ ویجدانن
زیندوون لە مولکماندا
لەو دەشتی دوور و پاندا
لەژێر عاسمانان دەژین

جارێک نالێن ئێمە چین!
هەڵدەمژن هەوای ئێمە
نارەقسن بە نای ئێمە
پیتاک نادەن بە جوانی
منیش بەباشم زانی:
جەندەرمە و کوتەکمان بێ
پیاوی خاوەن چەکمان بێ
تا کێ زۆر باج ناهێنن
تۆزێکیان تێ سرەوێنن
ئەم کابرا سمێڵ فشەی
زلەی بە نرکە و مشەی
مل چرچەی شەپکە لەسەر
لەژێر دەستی دان نووسەر
کاکی سەرۆک تەشریفە
زۆر پیاوێکی زەریفە
هەرکەس بێتە کۆشکەوە
یان دەرچێ لە دەرکەوە
دەیان نووسن لە دەفتەر
جا ئێواران سەر لەبەر
هاتووچۆکەر دەبژێرن
ڕاستی گەلێک بەخێرن
جێ ڕاخەر و جێ هەڵگر
کێشکچی جوچک و مامر

چەند حـــەمـــامـــچی و کـــارەکـــەر
چەنـد دەرکــــــەوان و نـۆکـــــــەر
هێـنـدە دەسـت و پـێـــــــــــوەنـدن
خـــــۆشـــــیـــــان نـازانـن چەندن

## دیموکراتی ئاوایە؟

ئەوی پـێـــــتـــــانم فــــەرمــــوو
هەڵـم بژارد مــــــاست و مــــــوو
تـەنـیــــــــا هـی مـن، ئـی وانـیـش
یانـی ڕەفـــــیـــــقـــــەکـــانـیش؟
چازان و شـــێخ مـــحـــیـــەالدین
وا بــزانم زۆر پـتــــــــــــــر نـین
دیـوکـــــــــــــــراتـی ئـاوایـــە
هەمـــــوو کـــــەســـــێک برایە
لـەو ڕۆژەوە کـــــــــــە هـاتـوویـن
بۆ کـــۆشک دەســــتـــەبەر بووین
نـەرم و ڕەق هـەرچـی مـــــــــاڵـە
بـــەشـــــی ئـــەم دوو هـــەواڵـــە
وەک خـــــــــۆم دامـنـاوە و چـاتـر
جـــــــا ئـێـــــوەش، تـۆزێ زیـاتـر
سێ ئـەوەنـدە بـژمـــــــــێـــــــــرن
خـــــــــواردنمـان بـۆ بـنـێــــــــرن

## کوێخاتان کەم نییە!

دەمــــــەوێ تـێ گـــــــەیـن بـاش
چمـــان نەخـــواســـتـــوە، بەلاش

ئەمانە گشت نان دەخۆن
کارتان بۆ دەکەن، جا چۆن
لە ئێمەو دێتە بەرچاو
گۆشت و ڕۆن و نان و ئاو؟
ئێمەش زەحمەتمان کێشا
شان و پیلمان زۆر ئێشا
مێشک و بیرمان ماندوو کرد
کۆشکێکمان لە نەبوو کرد
ناوبانگی کۆشکی ئێوە
گەیوەتە کوێ لە کوێوە!
خوا ئێمەی بۆ گەیاندن
دنیامان پێ ناساندن
دەتوانن خۆ هەڵکێشن
لە کۆشکا زۆر لە پێشن
هیچ کەس شتی وای نییە
کەس هێندە کوێخای نییە

## قەدر گرتن

ئەمڕۆش کەوا میوانن
نامەوێ وای بزانن
من ئێوەم لە بیر نییە
نەقڵی مار و سیر نییە
هەرچی لێتان سێنراوە
خۆ تەواوی نەخوراوە
ئەو مەڕانەی هێناتان

بە دیاری بۆ براتان
گۆشتیان خورا لە چێشتا
سەریان هەرماوە هێشتا
دادەی نۆکەر ڕاپەڕن
بێنن چی سەرە مەڕن
ڕاکەن، زووکەن، بزانم
ئێوەش ئەی براکانم
هەرکەس سەرێ وەرگرێ
بێ زەحمەت بچێتە دەرێ
بەگ کردنی وڕ و کاس
هێندەی هەڵڕژت قسە و باس
خەڵکی شار بە لارە لار
دڵ بریندار و هەژار
سەر بەدەست بە پرتە پرت
بەرەو دەرکە ڕێی داگرت

## سەری پووچەڵ

دەیان ویست بچنەوە ماڵ
لەپڕ کوڕێکی منداڵ
بانگی کرد: خەڵکە مەڕۆن
دەچنەوە ماڵ چی دەخۆن؟
ئەم سەرانە کوڵاون
مێشکەکانیان نەماون!
قولی بەگ لە پەنجەرێ

سەری هێنایە دەرێ
گوتی ڕۆڵەم مەوەستێ
بۆ مێشک چ دەربەستێ؟
مێشک بۆ ئێوە چییە؟
چ بەهرەی پێوە نییە!
یەکێکی تر نەڕڕانی:
ئەدی کوانێ زمانی؟
گوتی: گیانی شیرینم
زمان دارت نەبینم
چ کارێکتان بە زمانە؟
مەپرسن لەم نەزمانە
خوا نەکا زمانوو بێ
بۆ ئێمە زیانوو بێ!
یەکێ هەرای کرد بە قاو
کێ دیویە سەری بێ چاو!
قولی بەگ تووڕە بوو لێی
گوتی: چاو زیت کوڕی کێی؟
چاوتان بۆ چییە؟ چاوم
لەداخان هەڵمساوم
چاو بۆ دین داندراوە
نابینن، چوو لە چاوە!

## سەری ناوی

دیسان گەلی ژیان تاڵ

بزووتنەوە بەرەو ماڵ
ڕازی بە سەری کوڵاو
بێ مێشک، بێ زمان و چاو
بەڵام لاوێک نێرە کوڕ
گوڕاندی بە هێز و گوڕ:
من ئەم سەرەم بۆ چییە
هەرگیز کارم پێی نییە
سەر لە دەستا، خۆی بادا
گرتی و بە کۆشکی دادا

## ڕەهۆڵ

عالەم بە جارێک تاسان
کەوا بە سووک و هاسان
کۆشک کون بوو بەو سەرە
لەرزی دەرک و پەنجەرە
جێی ئەم سەرە چکۆڵە
زلە دەڵێی ڕەهۆڵە
دیارە تیتاڵ و هۆ بوو
قسەی مەلا درۆ بوو
سەر کۆشک دەڕووخێنێ
هەرکەس سەری خۆی بێنێ

## سەر باران

هەرچی سەریان لە دەستا
هەموو بەڕیز ڕاوەستا

بانگی کرد یەکێکی پیر
پیری دنیادیدە و ژیر:
یاڵڵا کوڕگەل خۆبادەن
سەرتان بە کۆشک دادەن
یەک جێ لە لایەن یاران
کۆشک کرا سەرباران
کۆشکی زل کردی خرمە
لە دوور دەبیسرا گرمە
هەرچی تێدابوو مردن
چەوتی بەو دەردەی بردن
هەر هێندەی یەک کفلە کوون
دەتگوت تەنبەڵ هەر نەشبوون
کۆشک نەیما ئاسەوار
بێجگە نەحلەت لە زۆردار

**بەزمە**

منالْ و پیر و جحێڵ
دەستیان دا پێمەڕە و بێڵ
پاکیان کردەوە تەواو
بلوور و شووشەی شکاو
لەجێ کۆشکا گرتیان دەست
لاوی قۆز، کیژی چاومەست
ڕۆینە و چۆپی و شێخانی
دەیانگوت بە گۆرانی:
«بە زۆر بستێنی مەڕێ

کەللەسەرت دێتە ڕێ»
پاش بەزم و شیرنی خواردن
کەوتنەوە هەڵبژاردن
کێ جاران کار ڕێکخەر بوون
کێ زۆرتر بەهرەدەر بوون
هەڵبژێران دووبارە
پێ ڕابگەن بەو شارە
دیسان وەک جاری جاران
دەستیان دایەوە کاران
هەرەوەزی ژیایەوە
بژیو زۆر کرایەوە
بەختەوەری و ژینی خۆش
خەمی کردن فەرامۆش

### هەر عەقڵەی لە خەسارێک

تێگەیبوون لەو مەدایە
هۆی چی بوو ئەو بەڵایە
زانییان کە خوێندن نەبوو
بەو دەردەی بردن کەبوو
دەرسیان وەرگرت دەرسێ باش
قەراریان دا لەمەوپاش
هێند دروست کەن مەدرەسە
تا خۆیان دەڵێن بەسە
چ کچ بێ و، چ کوڕ، مناڵ
تا دەگاتە چاردە ساڵ

مـــــــــــەیـلـی بـێـنـێ و نـەهـێـنـێ
بـە زۆر دەبـوو بـخـــــــــــوێـنـێ
هـــەر مـــنـــاڵـــێ وریـــا بـــێ
بـا خـــــــــــوێـنـدنـی بـاڵا بـێ
زۆربـن خـــــــــوێـنـدنـگـای بـڵـنـد
ریـشـــــــــەی ژیـان بـکـەن تـونـد
گـــەر خـــوێندەوار بێ کـــۆمـــەڵ
نـاخـــــوا فـــــریـوی تـەنبـــــەڵ

## وەسیەت

تا ئێـــســـتـــاش کـــۆنە پیـــاوان
وەســــیـــــەت دەکـــــەن بۆ لاوان
دەغـــیـل: نـەکـــەن بەهیـچ جـــوور
دروست کـــــەن کـــــۆشـکی بـلوور
بـەڵام دنـیـــــــابـوو، رۆژگـــــــار
تـووشـی کـــــــــــردن بـە نـاچـار
پـێـــــشــــتـــــان وابـوو لاناچێ
بـە هـیـچ قـــــــــوڵـنـگ و پـاچێ
سێ چـوار ســــــــــەری بـاوێـنـێ
خـــــاترجـــــەم دەیـڕووخــــێنێ

***

## بە پاکی بمرە

قـەسـاب سـەر دەبڕن بێ غـەش و سـاغـان
لـەوەڕ و ئـاخـــــــوڕ بـۆ دەغـــــــــەزدارە
گـــەر لە ئامـــانجـــا ســـاغـی وەرە پێش